لە دێیەکی یەریڤاندا، پیاوێکی پیر بەتاقی تەنها دەژیا، مرۆیەکی لاواز ونەخوش بوو. پاسەوانی باغچەی هەرەووەزی لادێکە دەکردو لە پاڵیدا سەبەتەی دروست دەکرد. زەمانێکە ئەم پیاوە لە جێگایەکی دوورەوە هاتیوو و لەو دێیە نیشتەجێ ببوو؛ هەر لەو کاتەوە دانیشتوانی دێکە درکیان بەوە کردبوو کە ئەم پیاوە زۆری بەسەر هاتووە. پیاوەکە نەختێك دەشەلی وپرچیشی پێشوەخت سپی بۆتەوە؛ لەسەر روومەتی ئاسەواری برینێکی درێژ مابووەوە؛ هەر لەسەر گۆنایەوە تا سەر لێوی درێژ بوو؛ هەر بۆیەش تەنانەت لە کاتی پێکەنینیشدا ڕوخسارێکی خەمگین و داماوی هەبوو.

رۆژێکیان سیڤان بە سەر پەرژینی باغچەی هەرەووەزێکە سەرکەوت، بۆ ئەوەی بە دزیەوە تێرتێر سێو بخوات، بەڵام پانتۆڵەکەی بە میخێکی پەرژینەکەوە گیریخواردو کەوتە سەر دارە دڕکێك، هەموو گیانی بریندار بوو. لەبەر ئازاری برینەکەی هاواری لێهەستا، پاسەوانەکەش دەستبەجێ گەیشتە سەری.

پاسەوانەکە زۆر بە ئاسانی دەیتوانی سزای سیڤان بدات یا خراپتری بەسەر بهێنێت، بۆ نموونە بیبات بۆ قوتابخانەکەی و بە قوتابی و مامۆستاکانی بڵێت چ کارێکی نابەجێی کردووە، بەڵام مامەپیرە بەزەیی بە حاڵی سیڤان هاتەوە، دەیبینی دەستوپەلی هەموو خوێناوی بووە، پانتۆڵەکەی وا دڕابوو، پارچەیەکی وەك کلك پێدا شۆڕ ببووەوە، بەسەر گۆنا سوورەکەی هۆن هۆن فرمێسك دهاتەخوارەوە. پیرە، بەبێ دەنگ، سیڤانی لە هەرەووەزێکەوە بۆ دەرەوە بەرێکرد، تەنانەت بەدوایشەوە دەنگێکی هەڵنەبڕی.

سیڤان لەبەر شەرمەزاری و ئازارەکەی رووی لە دارستان کرد، رێگاکەی لێ ونبوو، خۆیی لەناو لیتاوێك بینیووە ولە کۆتاییشدا ماندوو بوو. لەناو قەوزەی لیتاوەکە بەردێکی بەرچاوکەوت و لەسەری دانیشت، بەڵام یەکسەر بەزیرەیەکەوە لە سەریدا هەستا. یەکەمجار وای زانی لەسەر ماڵە هەنگێك دانیشتووە و لە تۆی پانتۆڵە دڕاوەکەیەوە پێیانداوە، بەڵام هیچ هەنگێکی لەسەر بەردەکە بەرچاو نەکەوت و بۆی دەرکەوت، بەردەکە وەکو خەڵوزێکی سوور گەرمە. لەسەر دیووە سافەکەی پیتی نووسراوی قوڕاوی بەرچاوکەوت. سیڤان لەبەر خۆیەوە ووتی: ئەمە بارودۆخێکی ئاشکرایە، ئەم بەردە تەڵیسماوییە، پێڵاوەکەی داکەنی و بە ژێرەکەی قوڕەکەی لە سەر نووسینەکە لابرد، پاشان دەستیکرد بە خوێندنەوە: هەر کەسێك ئەم بەردە بۆ سەر شاخەکە سەربخات وپاشان بیشکێنێت لاوێتی بۆ دەگەرێتەوە، دەتوانێت ژیانی سەر لە نوێ دەسپێبکاتەوە. لە خواریشیەوە مۆرێکی بە سەریەوە بوو، بەڵام مۆرەکە بازنەیی نەبوو وەك مۆری شووڕای لادێکە، سێ سووچیش نەبوو وەك مۆری بازاڕی هەرەووەزیکە، بەڵکو زۆر ئاڵۆز بوو.

سیڤان خەم دایگرت، چونکە تازە تەمەنی بووە بە هەشت ساڵ، ژیان سەر لەنوێ دەستپێکردن ئەوە دەگەیەنێت، سەرلەنوی بچێتە پۆلی یـــەکەم، بۆ ئەمەیش بە هیچ جۆرێك ئارەزووی نەماوە، ئەگەر بەردەکە

یارمەتی بدابا بەبێ خوێندن بۆ پۆلی سێهەم بازبدات، ئەوا ئەمەیان مەسەلەیەکی ترە و دەیکرد، بەڵام هەمو کەسێك دەزانێت سیحراویترین بەرد کارێکی وای پێناکرێت.

کاتێك سیڤانی خەمدار، بۆ ناو دێکە دەگەڕێتەوە، لەتەنیشت باغچەی هەرەوەزێکە تێدەپەڕێ، سەرلەنوێ چاوی بە پاسەوانەکە دەکەوێت، وەك هەموو جارێك دەکۆکێ و زۆر جار لەکاتی ڕۆیشتنیدا ڕادەوەستێت وپشوویەکی کورت دەدات، سەتڵێکی گەچ هەڵگرتووە وگسگێکی لەسەر شانە. لەم کاتەدا سیڤان کە هەر بە سروشت منداڵێکی ئازایە، بیرێکی بۆ کردەوە: ئەم پیاوە بەبێ سێ ودووکردن دەیتوانی فەلاقەم بکات، بەڵام بەزەیی پێکردم، منیش بە هەمان شێوە بەزەییم بە ئەو دێت، گەنجایەتێکەی بۆ بگەڕێنمەوە بۆ ئەوەی چیتر نەکۆکێت، نەشەلێت و چیتر بە زەحمەت هەناسە نەدات. سیڤان بە نیازێکی وا باش چوو بۆ لای و یەکسەر بۆی گێڕایەوە، چی دۆزیوەتەوە. پیرە بە روخسارێکی مۆنەوە سوپاسی کرد، بەڵام ئامادە نەبوو جێی کارەکەی بەجێبهێڵێت و بەرەو لیتاوەکە بڕوات، چونکە *هێشتا* لەم دنیایەدا کەسانێکی وا هەن ئامادەن لەو ماوەیەدا بۆ ناو باغچەی هەرەوەزێکە بڕۆن و بەروبومەکەی تالاّن بکەن. پیرە بە سیڤانی ووت <بەخۆت بڕۆ بەردەکە بۆ سەر شاخەکە سەربخە، پاشان منیش بۆ یەك چاوتروکاندنێك دێم و بەهەر شتێك بێت، خێرا هەوڵی شکاندنی دەدەم. ئەم بادانەوەیە نەچوو بە مێشکی سیڤان، بەڵام لە بەر ئەوەی نەیویست بێزاری بکات، هیچی تری نەوت.

بۆ ڕۆژی داهاتوو، سیڤان گونیەیەکی باشی خستە سەر شان، بۆ ئەوەی دەستی نەسوتێت دەستکێشێکی لە گەڵ خۆی هەڵگرت و ڕێگای لیتاوەکەی گرتە بەر. لەوێ ڕەنجێکی زۆری دا، بەردەکە لە ناو لیتاوەکە دەربکات، هەموو گیانی بوو بە قوڕوچڵکاو، بە هەناسە بڕکێیەکەوە بەردەکەی گەیاندە سەر گیا ووشکبۆکەی کەناری شاخەکە، لەو بڕوایەدا بوو کە ئێستا ئیتر دەتوانێت بۆ سەری شاخەکە سەرییخات، پاشان پاسەوانەکە دەگاتە لای، بەردەکە دەشکێنێت و گەنج دەبێتەوە، تەمەنی گەنجایەتی سەر لەنوێ دەسپێدەکاتەوە. خەڵکی دێکە دەڵێن پیرە دنیا دیدەیە، کابرایەکی بێکەس و بەتەمەنە، هەروا نەخۆشە و لەشی زۆر برینداربووە، بێگومان بە هیچ جۆرێ ژیانێکی بەختەوەری بەسەر نەبردووە، بەڵام کەسانێکی وا هەن بەختەوەریان بینیوە. بەخودی سیڤان کە هێشتا گەنجێکە، هەتا ئێستا سێ جار بەختەوەری هاتووەتە ڕێگای. جارێکیان لەوەدا بوو لە قۆتابخانە دوا بکەوێت، لەسەر ڕێگا شوفێرێکی نەناس سواریکرد و ڕێك لە کاتی خۆی بە دەوام گەیشت. جارێکیتر لە بەهار ماسیەکی ناو گۆمە ئاوێك بە دەستگرت، جاری سێهەمیش ڕەنجەی مامی بردی بۆ یەریڤان، لەوێ ئاهەنگی یەکی ئایاریان دەگێڕا. سیڤان لە بەردەم خۆیەوە وتی: دەبێ ئەم پیاوە پیر و خێرنەدیوە، ژیانێکی باشتر بە سەر ببات، هەستایە سەر پێ و بەشێنەیی بەردەکەی بۆ سەر شاخەکە سەرخست .

پێش خۆرئاوابوون سیڤان ماندوو بوو، لە سەرمادا دەلەرزی، جلوبەرگە تەڕو پیسەکەی لە تەنیشت بەردە گەرمەکە هەڵخست. لەم کاتەدا پیرە پەیدا بوو.

سیڤان بە سەرسورمانێکەوە پێی وت: باوەڵێ ئەوە تۆی، ئەی باشە ئەوە بۆچی نە چەکوشێك، نە تەورێك یان بەردشکێنێکت لەگەڵ خۆ نەهێناوە؟ یا دەتەوێت بەردەکە بە دەست بشکێنیت؟

پیرە لە وڵامدا ووتی: سیڤان نەخێر، من نامەوێت بەردەکە بە دەست وردووخاش بکەم، بە هیچ شێوەیەك نامەوێت بەردەکە بشکێنم، چونکە من نامەوێت ژیانم سەر لەنوێ دەستپێبکەمەوە. پاشان لە سیڤانی تاساو نزیکتربووەوە و دەستێکی بەسەر سەری هێنا ـ سیڤان هەستی بە دەستە قورس و لەرزاوێکەی کرد ـ تۆ لەو بڕوایەدا بووی من پیاوێکی پیرو سەقەت وخمبارم، بەڵام لە ڕاستیدا من خۆم بە بەختەوەرترین مرۆڤی جیهان دەزانم. کاتی خۆی کە هێشتا بە لێنەهاتویانەوە پەرژینەکانمان دەڕوخاند، مەتەرەسمان دژی ڕژێم دادەمەزراند، ئەستونێك ڕووخا و

قاچی شکاندم. ئەو کاتە دژی قەیسەر، ڕاپەڕینمان بەرپاکرد، ئەو ڕاپەڕینانە کە تۆ تەنها بە وێنەکانەوە دەیانناسیت. هەروا ئەوان ددانەکانمیان شکاند، ئەمەش هەر کاتی خۆی ڕوویدا، ئەو کاتەی لە ناو زیندان هەمومان پێکەوە سرووده شۆڕشگێرانەکانمان دەوتەوە. لە گۆڕەپانی خەباتدا بە شمشێر ڕوومتیان لەتکردم، ئەمیش هەر ئەو کاتە ڕوویدا، لەو کاتە کە یەکەم حکومەتی گەل، خەبات لە دژی لەشکری سپی دوژمنانی بەرپادەکرد.

لە ڕۆژێکی سەرماوسۆڵدا لە ناو خانویەکی تەختە، تووشی نەخۆشی تیفۆ بووم و لەسەر جێگا پووشەکە، دەتلامەوە. لەم کاتەدا هەواڵی ئابلوقەدانی حکومەتە شوورایيیکەمان و هەوڵی دوژمنان بۆ لە ناوبردنمان، لە مەرگ زیاتر هەڕەشەی لێدەکردم. بەڵام کاتێك لە گەڵ یەکەم تیشکی ڕۆژی بریقەدار، بەخەبەر هاتم، هەواڵی تێکشکاندنی هێزەکانی دوژمنانم، پێگەیشت و سەر لەنوێ ئێمە کەوتینە باری هێرش بەرپاکردن. بەختەوەرانە لەسەر سەرینە تەختەیەکانەوە پەنجە ئێسقانوایێکانمان بۆ یەکتری درێژ دەکرد، بەشەرمێکەوە خەونمان بەوە دەبینی، وڵاتە شوورايیکەمان لە ئێستا گەورەترو بەهێزتر ببێت، نە بۆ سەردەمی ئێمە، بەڵکو بۆ نەوەکانی پاش ئێمە. ئایا ئەمە بەختەوەری نییە، سیڤان؟ جا من چ پێویستیەکم هەیە بە ژیانێکی تر؟ گەنجایەتییەکی نوێ؟ ڕاستە ئەوەی من ژیانێکی سەخت بوو، بەڵام ژیانێکی خاوێن و ڕاستگۆیانە بوو!

پیرە بێدەنگ بوو و سبیلەکەی دایگیرساند. سیڤان بە هێمنی پێووت: بەڵێ باپیرە، کەوابێ ئیتر من لە بەرچی خۆمم بەم شێوەیە ئازاردا و بەردەکەم بۆ ئێرە سەرخست، لە کاتێکدا دەشکرا هەر لە جێگاکەی خۆی لەناو لیتاوەکە بیهێڵمەوە ؟.

پیرە: لێبگەڕێ با هەر لێرە بێت، دەبینیت چی لێدەکرێت.

ئەوە چەندین ساڵە بەسەر ئەم ڕووداوە ڕۆیشتوە، بەڵام بەردەکە هێشتا هەر وەك خۆی لە سەر شاخەکە ماوەتەوە. زۆر کەس دەهاتن بۆ بینینی بەردەکە، تەماشایان دەکرد، بیریان لێدەکردەوە، سەریان بۆ بادەدا و بەرێگای هاتنەکەیانەوە، دەگەڕانەوە. جارێکیان منیش بۆ سەر شاخەکە ڕۆیشتم، لەوێدا ویژدانم ئازاری دام وگێژبووم، پاشان وتم جا بۆ نا، بەردەکە دەشکێنم و ژیانم سەرلەنوێ لە ئەوەڵەوە دەستپێدەکەمەوە. بەڵام نەختێك ڕاوەستام وخۆمم هێنایە پێش چاو و لەبەر خۆمەوە ووتم قسەی قۆڕ، هاوسێکان چیم پێدەڵێن ئەگەر ئێستا بە خۆگەنجکردنەوەوە بمبینن؟ بێگومان یەکسەر دەڵێن ئەوە گێلە پیاوەکەیە، کاتی خۆی نەیزانی چۆن بژێت، ڕێگای بەختەوەری بەدی نەکرد، ئێستا تازە بە تازە دەیەوێت سەر لەنوێ ژیانی لە ئەوەڵەوە دەستپێبکاتەوە .

جگەرەیەکم پێچایەوە و بە بەردەکە دامگیرساند بۆ ئەوەی تەڵە شخاتەیەکی کەمتر بەکاربهێنم و بە ڕێگاکەی خۆم گەڕامەوە.

نووسەر : ئەرکەدی کەیدار

لە ڕووسیەوە بۆ ئەڵمانی : تۆماس ریشکە

وینەکێش : پیترا ڤیکانت

لە ئەڵمانییەوە بۆ کوردی: سەلام عەبدوڵلا

1997/10/26